# شرح حديث الدين النصيحة

لإمام أبو بكر محمد بن حسين الآجري (٣٦٠ هـ) رحمه الله



وەرگێڕانی :
مجد الحنبلي

١٤٤٤ هـ

# شرح حديث الدين النصيحة

لإمام أبو بكر محمد بن حسين الآجري (٣٦٠هـ) رحمه الله



وەرگێڕانی :

مجد الحنبلي

١٤٤٤ هـ

١ - قال **أبو بكر الآجري** حدثنا محمد بن يحي بن سليمان أبو بكر المروزي، ثنا عبيد الله بن محمد العيشي، ثنا حماد بن سلمة، أنا سُهيل بن أبي صالح، عن عطاء بن يزيد الليثي، عن تميم الداري رضي الله عنه : أن رسول الله ﷺ قال : (إن الدِّينَ النَّصيحةُ، إن الدِّينَ النَّصيحةُ)، ثلاث مرات.

قال : لمن يا رسول الله؟

قال : ( للهِ، ولرسولِه، ولكتابِه، ولأئمَّةِ المُسلمين وعامَّتِهِم).

له تميم الداري ـهوه رضي الله عنه رسول الله ﷺ فهرمووى : (دين دڵسۆزى و دڵپاكييه، دين دڵسۆزى و دڵپاكييه) سێ جار واى فهرموو .

وتى : بۆ كێ يا رسول الله ؟

فهرمووى : (بۆ الله، و بۆ پێغهمبهرهكهى، و بۆ كتێبهكهى، وه بۆ پێشهواياني موسڵمانان، و عهوامهكانيشيان) .

قال **محمد بن الحسين** :

٢ - قد سألنا سائل عن هذا الحديث، فقال : تخبرني كيف النصيحة لله عَزَّ وَجَلَّ؟

وكيف النَّصيحةُ لكتاب الله جل ثناؤه؟

وكيف النَّصيحةً لرسول الله ﷺ ؟

وكيف النَّصيحة لأئمة المسلمين؟

وكيف النَّصيحةّ لعامتهم؟

فأجبناه فيه كيف النصيحة على هذا الترتيب الذي سأل عنه بجزء، فينبغي لكل مؤمنٍ عاقلٍ أديبٍ يطلبُه ويتعلمه، والله الموفق لذلك.

پرسیارکەرێك دەربارەی ئەم فەرمووودەیە پرسیاری لێ کردین، وتی : پێم دەڵێ دڵپاکی و دڵسۆزی بۆ الله عز و جل چۆنە؟

وە دڵپاکی و دڵسۆزی بۆ کتێبی الله چۆنە؟

وە دڵپاکی و دڵسۆزی بۆ رسول الله ﷺ چۆنە؟

وە دڵپاکی و دڵسۆزی بۆ پێشەوایانی موسڵمانان چۆنە؟

وە دڵپاکی و دڵسۆزی بۆ عەوامەکانیان چۆنە؟

ئێمەش وەڵامان دایەوە کە دڵپاکی و دڵسۆزی چۆنە لەسەر ئەو ڕیزبەندیەی کە بەش بەش پرسیاری لە بارەیەوە کرد، جا دەبێ هەموو ئیماندارێکی عاقڵ و موئەدەب بە دوایدا بگەڕێ و فێری ببێ، والله الموفق .

قال **محمد بن الحسين** :

**٣** - ولا يكون ناصحًا لله ولرسوله ولأئمة المسلمين وعامتهم إلاَّ من بدأ بالنصيحة لنفسه، واجتهد في طلب العلم والفقه، ليعرف به ما يجب عليه، ويعلم عداوة الشيطان له، وكيف الحذر منه، ويعلم قبيح ما تميل إليه النفس حتى يخالفها بعلم .

وه نابێته دڵپاك و دڵسۆز بۆ الله و پێغەمبەرەكەی ﷺ و پێشەوایانی موسڵمانان و عەوامەكانیان ئیللا كەسێك نەبێ كە سەرەتا دەستی كردووە بە دڵپاكی و دڵسۆزی بۆ نەفسی خۆی، وە تێكۆشاوە لە داوا كردنی عیلم و فیقهـ، تاكو ئەوەی پێ بناسێت كە واجبە لەسەری، وە دوژمنایەتی شەیتانیش بۆ ئەو بزانێ، وە بزانێ چۆن ئاگاداری بێ، وە ئەو ناشرینیەی كە نەفس مەیلی بۆی هەیە بیزانێ تاكو بە عیلمەوە سەرپێچی لێ بكات .

**٤** - وروى الثوري، عن عبد العزيز بن رفيع، عن أبي ثُمامة - وكان يقرأ الكُتب -، قال : قال الحواريون لعيسى ابن مريم: من الناصح لله تعالى؟

قال : الذي يبدأ بحقِّ الله قبل حقِّ الناس، فإذا عُرض له أمران، أمرُ دنيا وآخرة، بدأ بعمل الآخرة، فإذا فرغَ من أمر الآخرة تفرَّغ لأمر الدنيا .

وه الثوري گێڕایویەتیەوە، لە عبدالعزیز بن الرفیع ـەوە، لە ابي ثمامەوە کە کتێبی دەخوێندەوە و وتی : حەواریەکان بە عیسی بن مریم یان علیه السلام وت :کێ دڵسۆز و دڵپاکە بۆ الله تعالی؟

فەرمووی : ئەو کەسەی دەست دەکات - بە گەیاندنی - مافی الله لە پێش مافی خەڵکییەوە، جا ئەگەر دوو کاری بۆ هاتە پێش، کارێك بۆ دونیا و کارێك بۆ قیامەت، ئەوا دەست دەکات بە کردنی کاری قیامەت، ئینجا کە لە کاری قیامەت تەواو بوو ئەوا دەستیشی بەتاڵ دەبێ بۆ ئەنجامدانی کاری دونیا .

٥ - وقال الحسن البصري: ما زال لله ناسٌ ينصحون لله في عباده، وينصحون لعباد الله في حقِ الله عليهم، ويعملون له في الأرض بالنصيحة، أولئك خُلفاء الله الأرض.

وه الحسن البصري وتی : هێشتا الله کەسانێکی هەیە کە دڵسۆزی و دڵپاکی بۆ الله دەردەبڕن لە بەندەکانیدا، وە ئامۆژگاری بەندەکانی الله دەکەن دەربارەی مافی الله لەسەریان، وە کردەوەی بۆ دەکەن لەسەر زەوی بە ئامۆژگاری کردن، ئا ئەوانە جێنشینەکان الله ن لەسەر زەوی .

قال **الآجري** رَحِمه اللهُ :

**٦** - والنصيحة لرسول الله صلى الله عليه وسلم على وجهين :

**أ** - فنصيحة مَن صَاحَبَه وشاهده.

**ب** - ونصيحة من لم يَرَه.

فأما صحابته :

فإن الله شرط عليهم أن يعزّروه ويوقِّروه، وينصروه، ويعادوا فيه القريب والبعيد، وأن يسمعوا له ويطيعوا، وينصحوا كل مسلمٍ، فَوَفُّوا بذلك، وأثنى الله عليهم به.

وأما نصيحة مَن لم يره:

فأن يحفظوا سُنَّته على أُمَّته وينقلوها، ويُعلِّموا الناس شريعته ودينه، ويأمروهم بالمعروف، وينهوهم عن المنكر، فإذا فعلوا ذلك فهم ورثة الأنبياء.

وأما النصيحة لأئمة المسلمين :

فهي على قدر الجاه والمنزلة عندهم .

**أ** - فإذا أمِنَ من ضرِّهم : فعليه أن ينصحهم.

**ب** - فإذا خشي على نفسه : فحسبه أن يُغيَّر بقلبه.

ج - وإن علم أنه لا يقدر على نصحهم فلا يدخل عليهم، فإنه يغشهم، ويزيدهم فتنة، ويذهب دينه معهم .

وە دڵسۆزی و دڵپاکی بۆ رسول الله ﷺ لە دوو ڕووەوەیە :

أ - دڵسۆزی و دڵپاکی ئەوەی کە هاوەڵێتی کردووە و بینیویەتی .

ب - وە دڵسۆزی و دڵپاکی ئەوەی کە نەیبینوە .

- سەبارەت بە هاوەڵەکانی :

الله بە مەرج دایناوە لەسەریان کە ڕێزی لێبگرن و بە گەورە ڕایگرن، وە پشتیوانی لێ بکەن، وە بۆی بگەڕێنەوە لە نزیك و دوور، وە گوێی بۆ بگرن و گوێڕایەڵی بکەن، وە ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەن، جا بە ئەمەك بوون بەرامبەر ئەمانە، و الله ش بەمانە ستایشی کردوون .

- وە سەبارەت بە دڵسۆزی و دڵپاکی ئەو کەسانەی کە نەیانبینوە :

ئەوەیە کە سوننەتەکەی بۆ ئوممەتەکەی بپارێزن، و نەقڵی بکەن، وە خەڵکی فێری شەریعەت و دینەکەی بکەن، وە فەرمان بە چاکە، و نەهی لە خراپە بکەن، جا ئەگەر وایان کرد ئەوا ئەوان میراتی پێغەمبەرانن .

- وە سەبارەت بە دڵسۆزی و دڵپاکی بۆ پێشەوایانی موسڵمانان :

بە پێی پلە و پایەیە لای ئەوان .

أ - ئەگەر ئەمین بوو لە زیانیان : لەسەریەتی کە ئامۆژگاریان بکات .

ب - وە ئەگەر ترسی هەبوو بۆ نەفسی خۆی : ئەوا بەسە بۆی کە پێی ناخۆش بێ و غیرەت بیگرێ بە دڵ .

ج - وە ئەگەر زانی کە توانای ئامۆژگاری کردنیانی نیە ئەوا با نەچێت بۆ لایان، چونکە غەشیان لێ دەکا، و فیتنەیان بۆ زیاد دەکا، وە دینەکەی لەگەڵیان دەڕوا .

٧ - وقد قال الفُضيل بن عياض : رُبما دخل العالم على الملك ومعه شيء من دينه فيخرج وليس معه شيء!

قيل له : وكيف ذلك؟

قال : يُصدقه في كذِبه، ويمدحه في وجهه.

جا الفضيل بن عياض وتی : لەوانەیە زانا بڕوات بۆ لای پاشا و شتێك لە دینی پێبێ بەڵام دێتە دەرەوە هیچی پێ نییە!

پێی وترا : ئەوە چۆن دەبێ؟

وتی : باوەڕ بە درۆکەی دەکات، وە ڕووبەڕوو مەدحی دەکات .

٨ - وقد روى الثورى، عن أبي حصين، عن الشعبي، عن عاصم العدوي، عن كعب بن عُجرة رضي الله عنه، قال : خرج علينا رسول الله ﷺ قال : (إنه سيكون بعدي أُمراء فمن صدقهم بكذبهم، وأعانهم على ظلمهم؛ فليس مني، ولست منه، ومن لم يُصدِّقهم بكذبهم، ولم يمنهم على ظلمهم؛ فهو مني، وأنا منه، وسيرد عليَّ الحوض).

وأما نصيحة العامة بعضهم لبعض :

فواجب على البائع أن ينصح للمشتري فيما يبيعه، وعلى الوكيل والشريك والخازن أن ينصح لأخيه، ولا يحب له إلَّا ما يُحبُّ لنفسه .

وه الثوري گێڕایویەتیەوه، لە ابی حصین، لە الشعبي، لە عاصم العدوي، لە كعب بن عجرة وه رضي الله عنه، وتی : رسول الله ﷺ هاته دەرەوە بۆ لامان و فەرمووی : (لە دوای من پێشەوایانێك دێن هەر كەسێك بڕوای بە درۆكەیان كرد، و یارمەتیانی دا لە ستەمەكەیاندا، ئەوا لە من نییە، و منیش لەو نیم، وە هەر كەس بڕوای نەكرد بە درۆكەیان، و یارمەتیانی نەدا لە ستەمەكەیاندا، ئەوا لە منە، و منیش لەوم، وە دێتە لام بۆ حەوزەكەم) .

- وە سەبارەت بە دڵسۆزی و دڵپاكی عەوام بۆ یەكتری :

واجبە كە فرۆشیار دڵپاك بێ بۆ كڕیار لەو شتەی كە پێی دەفرۆشێ .

وه - واجبه - لەسەر وەكیل و شەریك و گەنجینەوان كە دڵپاك بن بۆ براكانیان، و هیچ شتێكی بۆیان پێ خۆش نەبێ ئیللا ئەوە نەبێ كە بۆ خودی خۆشی پێی خۆشە .

٩ - وروى ابن عجلان، عن عون بن عبد الله ، قال : كان جرير إذا أقام السلعة بَصَّرهُ عيوبها، ثم خيَّره، فقال : إن شئت فاشتر، وإن شئت فاترك.

فقيل له : إذا فعلتَ هذا لم ينفذ لك بيع .

فقال : إنا بايعنا رسول الله ﷺ على النُّصح لكل مسلم .

وه ابن عجلان، گێڕاویەتیەوە، لە عون بن عبدالله وە، وتی : جرير رضي الله عنه ئەگەر كاڵای بفرۆشتایە عەیبەكانی دەخستە ڕوو، و پاشان كڕیاری سەرپشك دەكرد، و دەیفەرموو : ئەگەر ویستت بیكڕە، و ئەگەر ویستت وازی لێبێنە .

پێی وترا : ئەگەر ئاوا بكەی هیچ فرۆشتنێكت سەر ناگرێ .

فەرمووی : ئێمە بەیعەتمان دا بە رسول الله ﷺ لەسەر دڵسۆزی و دڵپاكی بۆ هەموو موسڵمانێك .

١٠ - قال **أبو بكر الآجري** : ثنا ابن شاهين، ثنا أبو هشام محمد بن يزيد الرفاعي، ثنا إسحاق بن سهل، عن المغيرة بن مسلم، عن قتادة، عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال : لا إسلام إلَّا بطاعة، ولا خير إلَّا في الجماعة، والنصح لله وللخليفة وللمؤمنين عامة .

له أبي الدرداء وه رضي الله عنه فه‌رمووى :

ئيسلام بوونى نييه ئيللا به گوێڕايه‌ڵى نه‌بێ، وه خێر بوونى نيه ئيللا له جه‌ماعه‌تدا نه‌بێ، وه دڵسۆزى بۆ الله و خه‌ليفه و ئيماندارانه به گشتى .

١١ - قال **أبو بكر الآجري** : ثنا جعفر بن محمد الفريابي، قال : ثنا قتيبة بن سعيد قال: ثنا معاوية بن عبد الكريم - وكان من ثقيف ولقبه : الضَّال - قال : سمعت بكر بن عبد الله المُزني يقول يوم الجمعة وأهل المسجد أحفل ما كانوا قط: لو قيل لي : خُذ بيد خير أهل المسجد لقلت : ودلوني على أنصحهم لعامتهم.

فإذا قيل : هذا، أخذت بيده.

ولو قيل لي: خذ بيد شرِّهم، لقلت، دلوني على أغشهم لعامتهم. ولو أن مُناديًا يُنادي من السماء : أنه لا يدخل الجنة منكم إلَّا رجل واحد، لكان ينبغي لكل إنسان أن يلتمس أن يكون هو ذلك الواحد.

ولو أن مُناديًا ينادي من السماء: أنه لا يدخل النار منكم إلَّا رجل واحد لكان ينبغي لكلِّ إنسان أن يفرق أن يكون هو ذلك الواحد.

معاوية بن عبدالكريم وتى : گوێم لە بكر بن عبدالله المزني بوو لە ڕۆژى جومعەدا لە كاتێكدا ئەهلى مزگەوت لە هەموو كاتێك زۆرتر بوون دەیوت : ئەگەر پێم بوترێ : بە دەستێك چاكترینى ئەهلى مزگەوت بگرە، ئەوا دەموت : ئەوانەم نیشان بدەن كە دڵسۆزترینیان بۆ عەوامەكانیان .

جا ئەگەر بوترێ : ئەوەتا، ئەوا دەستیم دەگرت .

وە ئەگەر پێم بوترێ : بە دەستێك خراپترینیان بگرە، ئەوا دەموت : ئەوانەم نیشان بدەن كە زۆرترین غەش لە عەوامەكانیان دەكەن .

وە ئەگەر بانگكەرێك لە ئاسمانەوە بانگ بكات : كە هیچ كەس لە ئێوە ناچێتە بەهەشتەوە ئیللا یەك پیاو نەبێ، ئەوا هەموو مرۆڤێك دەبێ ئومێدى هەبێ كە خۆى ئەو كەسە بێ .

وە ئەگەر بانگكەرێك لە ئاسمانەوە بانگ بكات : كە هیچ كەس لە ئێوە ناچێتە دۆزەخەوە ئیللا یەك پیاو نەبێ، ئەوا هەموو مرۆڤێك دەبێ ترسى هەبێ كە خۆى ئەو كەسە بێ .

